مەولەویش وەڵامی ناداتەوە. کاك ئەحمەد قەسەکەی لێ دووبارە ئەکاتەوە. مەولەوی هەر وەڵامی ناداتەوە. کاك ئەحمەد بۆ جاری سێهەمیش داوای لێ ئەکاتەوە، ئەم جارە مەولەوی ئەڵێ: لە جاری یەکەمدا کە پێت وتم، تەماشام کرد هیچ واجب و سوننەتێك نی‌یە تۆ تەرکت کردبن و من عەرزت بکەم بیکە. لە جاری دووەمیشدا تەماشام کرد هیچ حەرام و مەکروهێك نی‌یە کردبێت، تا پێت بڵێم تەرکیان بکە. ئێستا هەر ئەوەندەت عەرز دەکەم شەیتان خۆی مڵاس داوە بۆت، ئاگات لە خۆت بێ تەفرەت نەداو لە خۆتت بایی نەکا. جا کاك ئەحمەد گەلێ فرمێسك بەچاویا دێتە خوار.

خوالێ خۆش بوو سەیید ئەحمەدی عازەبانی بۆی گێڕامەوە وتی:

سەیید حەسەنی موفتی داوای حەبیبە خانی کچی شێخ عەلبی عەبابەیلێ ئەکاو ئەیدەنێ. جا کە لە سولەیمانی‌یەوە ئەڕۆن بۆ عەبابەیلێ بە شوێن بووکدا، شێخ عەلیی باوکی بە مەولەوی ئەڵێ مەولەوی من کەسم نی‌یە لەگەڵ حەبیبە بینێرم بۆ سولەیمانی و لە تۆ مەحرەم تر نی‌یە بە ماڵی ئێمە، لە گەڵی بڕۆ، ئەویش لەگەڵ بووك ئەڕوا.

لە ڕێگادا بە عادەتی برازاوا دەست دەکەن بە گۆرانی وتن. یەکێ لەو کۆمەڵە کە ناوی حەمەی ئامین بووە، دەنگی زۆر خۆش بووە. دەس ئەکا بە (قەتار) و (ئای ئای) وتن بە شیعری مەولەوی‌یەوە. مەولەوی بە سواریی وڵاخەوە لەبەر خۆشیی دەنگی حەمەی ئامین جەزبە ئەیگرێ و بە جۆرێ لە حاڵی تەبیعی دەرئەچێ ئەکەوێتە خوارەوە. خەڵکەکە دائەبەزن و ڕاستی ئەکەنەوەو سواری وڵاخەکەی ئەکەنەوەو لە حەمەی ئامینیش تووڕە ئەبن ئەڵێن خەتای تۆ بوو وا مەولەوی کەتە خوارەوە. حەمەی ئامینیش دێ بەلای مەولەوی‌یەوە پێی ئەڵێ قوربان بۆچی وات پێ هات، خۆ من هەر شیعرەکانی خۆتم ئەخوێندەوە؟ ئەویش ئەڵێ کوڕە کەی شیعری من ئەوەندە خۆش و بەتەئسیرە؟ بەخوا خەتای ئاوازەکەی تۆ بوو.

## پێوەندی ڕۆحیی مەولەوی

سەرەتای پێوەندی ڕۆحیی مەولەوی، وەك مەنسوبێکی تەرەیقەتی نەقشبەندی، بە شێخ عوسمان سیراجوددینەوە بووە. پاش کۆچی دواییی ئەو بووە بە مەنسووبی شێخ موحەمەد بەهائوددینی کوڕی و زۆری باوەڕ پێ بووەو بە (ئایینەی کامڵ) واتە ئاوێنەی تەواو پێگەیشتوو ناوی بردووە، واتە هەموو سیفەتە بەرزەکانی باوکی ڕەنگیان لە میشکا داوەتەوە.

مەولەوی بەنامەی بەرزو پرسۆز هەستی پاك و خاوێنی خۆی بەرابەر بەم دوو زاتە هەمیشە دەربڕیوە. لێرەدا بۆ نمونە ئەو پارچە شیعرەی ئەنووسینەوە کە بەبۆنەی هاتنەوەی شێخ بەهائودینەوە لە سەفەری حەج دایناوەو بۆی ناردووە:

ئاینەی کامڵ! ئازیزەکەی فەرد!<br>
فیدای ئامات بم صەفاییت ئاوەرد!<br>
خەیلێن گەرد پات نە دیدەم دوور بی<br>
یانەی چەم وێران تەمام خاپوور بی<br>
خاس بی تەشریفت هەم ئاوەردەوە<br>
گەرد پات وەتەن ئاواکەردەوە<br>
ساقی، ئینە بەزم وەصلێ یارانەن<br>
چەرخێ هەر ئەو چەرخ هەردە جارانەن<br>
دەورێ دەر بەزم وە پیاڵەوە

ژەنگ دڵ وە زاخ مەی بماڵەوە<br>
جامێمان جە دەس تۆ هەم سەندەبۆ<br>
فرسەتەن نصیو نەك نەمەندەبۆ(6)

## چەردەیەك لە بارەی ژیانی کۆمەڵایەتی مەولەوی‌یەوە

لەگەڵ ئەوەشدا کە مەولەوی لەبارەی ئابووریی‌یەوە هەرگیز ژیانێکی خۆشی ڕانەبواردووە، هەرگیز ئامادە نەبوە لە پێناوی ژیانی دنیادا دەس لە عیززەتی نەفسی خۆی هەڵگرێ. لە نامەکانی مەولەویدا کە دەستگیرمان بوون و هەروەها لەو دەنگوباسانەیەوە کە دەم بەدەم ئەگێڕرێنەوە، بۆمان



دەرئەکەوێ کە زۆرجاریش فەرمانڕەوایانی ناوخۆی ناوچەکە بەو جۆرەی کە شایانی کەسێکی وەك مەولەوی بی لە گەڵێ نەجوڵاونەتەوەو قەدریان نەزانیوە. کەچی فەرمانڕەوایانی قاجاری و ئەردەڵانی گەلێ جار بانگیان کردووەتە لای خۆیان و دێهات و موڵکیان داوەتێ، بەڵام ئەو قوبووڵی نەکردووەو هەرگیز نەیویستوە خزم و کەس و کارەکانی و ناوچەی کڕینی تاوەگۆزی بەجێ بێڵێ و بە موڵکی دنیای نەگۆڕێونەتەوە. بۆ نمونە فەرهاد میرزای مامی ناصروددین شا داوای لێ کردووە بڕوا بۆ ئێران و هەر موڵکێ دڵی ئەیگرێ هەڵی بژێری بۆ خۆی. غولام شا خانی ئەردەڵانیش داوای لێ کردووە بچێ بۆ ناوچەی سنەو دێی (زەلان) وەربگرێ بۆ خۆی، بەڵام مەولەوی هەر ئەوەی پێ باش بووە هەرچۆن بووە لە (سەرشاتە) کڕێنەکەی خۆی بمێنێتەوە.

مەولەوی تا ساڵی 1293ی هیجری، واتە تا دەساڵ پاش کۆچی دواییی شێخ سیراجودیین، بێ دەردو مەینەت ڕایبواردووە، بەڵام لەو ساڵەوە ئیتر کەتووەتە بەر تیری گەردوون. مردنی عەنبەر خاتوونی ژنی و، پاش ئەوە کوێربوونی خۆی و، ئەنجا سووتانی ماڵەکەی کە کتێبخانەکەشی تیا سووتاوەو، پاشتر کۆچی دواییی شێخی بەهائوددین و ئەو کەلێنە ڕۆحی‌یە گەورەیەی بەو ڕووداوە کەوتۆتە ژیانی و، پاش ئەوانەش لە وڵاخ کەوتنەخوارو پشت شکانی، هەموو ئەمانە دوا ساڵەکانی ژیانی یان لێ تاڵ کردووەو ئیتر تا سەری یەکجاری ناوەتەوە بەدەم دەردو ئازاری دڵ و دەروونەوە تلاوەتەوە.

## خێزان و منالّی مەولەوی

ئەوەی لە پاش ماوەی بنەماڵەی مەولەویمان بیستووە ئەوەیە کە مەولەوی تاقە ژنێکی هێناوەو ئەو ژنەیش (عەنبەر خاتوون)ی خوشکی (ئەکرەم) ناوی ئەفغانی بووە کە یەکێ بووە لە چەند ئەفغانی لە وڵاتی خۆیانەوە کۆچیان کردووە بۆ کوردستانی بابان و لە پەنای پاشای بابانەوە خۆیان گرتوەتەوە.

لەناو ئەمانەدا ئەکرەم زۆر دیارە سەربەدەرەوە بووە.

مەولەوی عومرێکی باش و خۆش و پڕ خۆشەویستی لەگەڵ عەنبەر خاتوون بەسەربردووە. ئەمەش بەوەدا دەرئەکەوێ کە بەمردنی عەنبەر خاتوون دنیا لە پێش چاوی مەولەویدا تاریك بووەو، گەڵێ پارچە شیعری ناسکی پڕسۆزی لە لا واندنەوەیا وتووە کە بەرزترین نموونەی شیعری خۆشەویستی و لاواندنەوەن لە ئەدەبی کوردیدا.

**مەولەوی لە عەنبەر خاتوون چەند کوڕو کچی بووە. کوڕەکانی ئەمانەن:**

(1)سەیید موحەمەد کە گەورە بووەو ژنی هێناوە، بەڵام لە ژیانی مەولەوی خۆیدا بە گەنجی و مردووەو لە دێی (گوندە) بە خاك سپێرراوە. ئەگێڕنەوە لە کاتی نەخۆشی مردنی ئەم کوڕەی مەولەویدا باوکی لە تەوێڵە بووە لای شێخ سیراجوددین. ئەنێرن بەدوایا بگەڕێتەوە. کە دێتەوە لە پشت دێی (عەنەب)ەوە دەس ئەکا بە گریان. لێی ئەپرسن بۆچی ئەگری؟ ئەویش ئەڵێ چۆن نەگریم! حەزرەتی یەعقووب بۆنی کراسەکەی یوسفی کوڕی بە لووتا هات پێی شادمان بوو، من بۆنی کفنی موحەمەدی کوڕم دێتە لووت و دڵم ئەبرژێ! کە ئەگاتەوە ماڵ ئەبینێ موحەمەدی کوڕی مردووەو شۆراوەو پێچراوە لە کفنەکەی و چاوەڕوانی گەڕانەوەی باوکین. ئەم سەیید موحەمەدە تاقە کوڕێکی بووە کە بەناوی موحەمەد سەعید بووەو وەچەی لێ کەوتووەتەوە

(2)شێخ موحەمەد کە ئەمیش گەورە بووەو ژنی هێناوە، بەڵام بە گەنجی مردووەو کوڕێکی لێ بەجێ ماوە کە ناوی عەلی بووە. ئەمیش هەروا وەچەی لێ کەوتووەتەوە.

(3)سەیید عەبدوڵڵا کە زۆر ژیاوەو چەند ژنی هێناوەو گەلێ وەچەی لێ کەوتووەتەوە.

(4)هیدایت کە بە گەنجی بەر لە ژن هێنان مردووە، بیستوومە شێخ بەهائوددین بەبۆنەی مردنی ئەم کوڕەوە چووە بۆ دڵدانەوەی مەولەوی و سەرخۆشی لێ کردنی. مەولەوی بەم هاتنەی شێخ ئەوەندە شادمان بووە وتوویە خۆزگە چەند کوڕم ئەبوو یەك لەپاش یەك ئەمردن بەمەرجێ تۆ بۆ پرسەی هەرکامیان بەم جۆرە ئەهاتی بۆ لام.

نەوەی مەولەوی هەموو ئینسانی ڕەوشت بەرزو بەشەرەف بوون و تێکەڵی یان لە گەڵ بنەماڵەی شێخ سیراجوددین بووەو هاتو چۆی شێخ ضیائوددینیشیان کردووە، تەنانەت ئەوەندە لەگەڵ ماڵی شێخ تێکەڵ بوون هەرچەندە هاتوونەتە بیارە ئەوەندە خۆیی بوون و ئەوەندە ماونەتەوە، زۆر کەسی نەشارەزا وایان زانیوە کوڕانی شێخن لە دەرەوە هاتوونەتەوە بۆ ماڵی باوکیان. ئەمانە زۆر بە قەناعەت و بوردەباری لە دێهاتی عەشرەتی خۆیانا، وەك (مۆرتکە)و (زارێن) (سەرشاتە) ڕایان بواردووە، لە گەڵ ئەوەش هەمیشە میوانیان بووەو خەڵك لایان داوەتە لایان و ماڵیان وەك کاروانسەرا بووە بۆ ڕێبوارانی ئەو ناوچەیە.

سەرچاوە :

بنەماڵەی زانیاران

بەشێك لە بەرهەمەكانی مەلا عەبدولكەریم

# گوڵی میانەڕەوی و چاكەكردن

بـــــــاران ئـــــــــەبارێ و زەوی ئـــــــــەبزوێ
گـــوڵ و دركـــــی تیـــــژ لـــــە عــــەردا ئـــــەڕوێ
تـــــۆ گـــــوڵ وەربگـــــرە جـــــوان و بـــــەڕێزە
لـــــە دركـــــی ئـــــازار خـــــۆت بپـــــارێزە

ان الله یـأمر بـالعَدلِ والاحْسـان وایتـاء ذی القُربـی وینـهی عـن الفحشـاء والمنكر والبغی یعظكم لَعَلكُم تذكرون.

پەروەردگاری عالەم لەم ئایەتە بەرزو بەنرخەدا فەرمان ئەدا بەسێ شت و نارەزایی دەرئەبڕێ لە سێ شت كە دیارترین شت لەوانەی پەیوەندیان هەیە بە دامـەزراندن و وێـران بونـی جیهانــەوەو بــە دامــەزران و دانەمــەزرانی ئـایینی ئینسانەوە.

ئـــەو شـــتانەی فەرمانی‌داوە بە كردنیان ئەمانەن:

یەكەم (عدل) واتە هاوســـــــەنگی و میانــەڕەوی لەهــەموو كـــارێكدا، كـــاری دەروونــــی بــــێ وەك بیروبــــــــاوەڕو خۆشەویســـتی یـــا دەرەكـی بێ لەوانـەی عیبـــادەت و ئـــایین پەرستین یـا لەوانـەی مایـــەی ژیـــانن، یـــا شتێكی تـر بـێ. بـۆ وێنـە ئـەبێ عـەقیدەو بیروباوەڕی ئادەمیزاد بەئەندازەیەك ڕێك و پێك و دامەزراوو قایم بی هەرگیز بەباری زیادەدا یا بەباری كەم و كورتیدا وای پـێ نـەیێ پێچەوانەی دین و ئایین و هۆشـی هوشـیار بـێ. هەندێ كەس كە خۆیان بەبـەراورد تەماشـایان كـردوەو لـە ئـەوزاعی جیهان خەبـەردارن وتویانـە هەرشـتێ لـە ئـەندازە لای دا زیـان ئەبەخشـێ. تەنانـەت عـەقیدەو بـاوەڕت بـە پێغەمبـەران ئـەبێ بـە میراتی بـێ نـەبێ بـەهۆی كـافربون و لەوەندە لانەدا كە خوای تەعالا لە شان و پایەیاندا بڕیاری‌داوە.

بەرابـەر بـە ئـاڵ و ئـەصحابی پێغەمبـەریش درودی خـوای لێ بـێ یـا بـە مەشایخ و ئەولیا ئەبێ لە ئەندازەی شەرع لانەدا و ئینسان ئەبێ باوەڕی وابێ كەوا ئەوان كەسانێكی سـیرەت و ڕەوشـت بـەرزو خـاوەن طاعـەت و عیبـادەت بوون و لای خوا پایەو مەقامێكی تایبـەتیان هەیە، بەڵام نابێ لـەم بـاوەڕەیدا زیـادەڕەوی بكـا و بگاتـە ئەندازەیـەك لـە دیـن لابـداو لـە سـنوری میانــەڕەوی دەرچـێ. ئەگــەر كەسـێكت خــۆش ویســت ئــەبێ ئەندازەیــەك بــۆ ئــەو خۆشەویسـتییەت دانێـی نـەبادا ڕۆژێ لـە ڕۆژان عـاجزی بكەوێتــە بــەینتان و بـەهۆی ئـەو خۆشەویسـتیە پێشـوەوە ئـەوەندە زیـادەڕەویت كردبـێ ئێسـتا مـەیدانی لادانـت نـەمابێ. ئەگـەر دوژمنـی كەسـێكیش بـوی پێویسـتە ئـەو دوژمنییە ئەندازەیەكی دروستی دروست و ڕەوای بۆ دابنرێ و زۆر لانەدەی و لە ئوسوڵی ناحەزایەتی عادەتی دەرنەچێ، نەكا ڕۆژێ لە ڕۆژان ئاشت ببنـەوەو ئەوكەسە ببێ بە دۆست و تۆیش لەبەر شەرمی خۆت ڕوت نەیەت چاوت بەو كابرایە بكەوێ. بۆیە حەزرەتی پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی:

((احبب حبیبك هو نامّا عسی ان یكون بغیضك یوما ما، وابغض بغیضك هو ناماً عسی ان یكون حبیبك یوماً ما)).

واتە:

دۆستی خـۆت بەمیانـە خـۆش بـوێ، نـەوەك ڕۆژێ بـێ ببـێ بـە ناحـەزت. ئەوەش كە ڕقت لێیە هەر لە میانە ڕقت لێ بێ، نەوەك ڕۆژێ بێ ببن بە دۆستی یەكترو خۆشت بوێ.

میانڕەوی لـە عیبادەتیشا ئەوەیـە حـەقی خـوداو حـەقی خـۆت ڕابگـرێ و نەحەقی ئەو بفەوتێنیی و نەخۆیشت ئەوەندە ماندو بكەی كە كـەڵكت پێـوە نـەمێنێ. لە حقوقی بەینی خۆت و خەڵكیشـدا ئـەبێ وابـی حـەقی خۆیشـت و حـەقی خـەڵكیش ڕاگیر بكەی و كەستان زیانتان لێ نەكەوێ، بەتایبـەتی ئەگـەر فـەرمانداری ئایینی بێ یا هی دنیایی ئەبێ بەتـەواوی میانڕەو بـی نەحـەقی خاوەنداواو نەحەقی داوا لێ كراو پشت گوێ نەخەی. بەكورتی وشـەی (عـەدل) بەم جۆرە كـە باسمان كـرد بـەجێ بـــەجێ كردنـــــی هـــــەمو واجباتێكا ئەگا. ئەگەر لەســـەر ئـەم ئوسـوڵە بـەرێدا بـڕۆی نەحـەقی خوات لەسەر ئەمێنێ و نەحـــەقی خــــەڵق و نەحـــەقی خۆیشـــت ئەفەوتێ.



دووهەم (احسان) واتـە بەجێ هێنانی هـەرچی چاكەیـە لەوانـە كــە واجـب نـین لەســـەر ئینسـان، خـوای لــە ئـەوزاعی دەرونـی بـی وەك خۆشەویســـتی خەڵك، لەو جۆرە كە واجب نیە لەسەر ئینسان، یاخود لە ئەوزاعی دەرەوە بێ وەكـو بـەجێ هێنـانی نوێـژو ڕۆژو حـەج و عـەمرەو قورئـان خوێنـدن و بـاقی عیبادەتـە سـوننەتەكان وەكـو بەخشـینی مـاڵ بـۆ میـوان و دۆسـتان و غـەیری ئەمانە لە بەشەكانی خێرات وەكو دروست كردنی مزگەوت و قوتابخانەو میوان خانەو باقی ئەوزاعی خێرات لەوانە كە واجب نین.

سێهەم (ایتاء ذی القربی) واتە بەخزمان، ئەم بەندە هەرچەندە بەر ئیحسان ئەكەوێ، بەڵام لەبەرئەوە كە خوای تەعالا زۆر جار لە قورئاندا داوای سیلەی ڕەحم ئەكا، ئەم باشەی تایبەتی كردووە بۆ ئەوەی ئادەمیزادی هوشیار باش تێ بگا كەوا پایەی خزمەتی و خزم و خوێش چەند بەرزە.

ئـەو شـتانەیش كـە مـەنعی كـردوون و نـارەزایی خـۆی لێیـان دەربڕیـوە، ئەمانەن:

(فحشاء) کە بریتیە لە هەر ناباریو ناڕەزاییەك کە بەزمان بکرێ وەکو کوفرکردن، پەنابەخوا، فیتنەو ئاشوب بڵاوکردنەوە لەناو ئادەمیزاداو وەك بوختان کردنو درۆ کردنو غەیبەتو تێکدانی ناوبەینی ژنو مێرد کوڕو باوكو بەرو دراوسێو دۆست و براو خزمو عەشرەتو خەڵك خراپ کردن لای پیاوی گەورەو دەست ڕۆیشتو و تانەو توانج گرتن لە خەڵكو ڕوشکاندنو غەیری ئەمانە لەو تاوانانەی بەزمان ئەکرێنو لە ژمارە نایەن.

(منکر)یش واتە هەر تاوانێ کە بەغەیری زمان بکرێ، واتە بەدەستو پێو چاو باقی ئەندامانی لەش بکرێ وەکو دەست بردن بۆ ناموس یا بۆ نەفس یا بۆ ماڵ یا بۆ سەلامەتی یەکێ بە هەر ئەسبابێ لەو ئەسبابانە کە بەعادەت بەکارئەهێنرێن کە ئەمەش کرداری وەك جەردەییو دزیو داگیرکردنی ماڵی خەڵكو لێدانو هەر جۆرە دەس درێژییەکی تر ئەگرێتەوە.

(بغی) پیش بریتیە لە ئەنانیەتو خۆ بە گەورە گرتنو فیزکردن بەسەر خەڵکداو یاخی بوونو سەرکێشی کردن بەرامبەر بە ڕاستیو وەرنەگرتنی قسەی ڕاستو دان نەنان بەوەدا کە واقیعییەو مل بادان لە ئاست واتەی بەسودو ئامۆژگاریو ڕێگەی ڕاست نیشان دان.

(ئاگادارکردنەوەیەك بۆ هۆشیاران) ئاشکرایە لای ئەوکەسانەی کە تەماشای تەفسیری قورئانی پیرۆز ئەکەنو لە عورفی لوغەتو عورفی عام خەبەردارن، کەوا وشەی (معروف)و (منکر) هەموو چاكو خراپێ ئەگرنەوە. وەك چۆن قابیلە وشەی (فحشاء) تەفسیر بکرێتەوە بە زیناکردنو دەست درێژی بۆ سەر ناموسی خەڵك، قابیلیشە تەفسیر بکرێتەوە بە هەر ئیشێکی تاوانباری. هەروەها ئەتوانرێ (منکر)یش تەفسیر بکرێتەوە بەهەر ئیشێ کە لە یاسای ئیسلامدا پەسەند نەبێ. (بغی)ییش تەفسیر بکرێتەوە بە هەمو دەست درێژییەك بەسەر حەقی خەڵکدا، وەك ڕەوایە تەفسیریش بکرێتەوە بە (زینا) وەك لە (قاموس)دا دەرئەکەوێ. بەپێی ئەم تەفسیرانە هەندێ لەم کەلیمە بەکارهێنراوانە مەعنای یەکتر ئەگرنەوە.

لەسەر ئەم ئەساسە لەم ئایەتە پیرۆزەدا زانایانی تەفسیر گەلێ قسەیان کردوە. هەندێکیان مەعنای مەحدودو بێ دەرەتانیان داوە بەم لەفظانەو، هەندێکیشیان مەعنای فراوانو دەرەتان دارو هەندێکیشیان لەگەڵ ئەوەشدا کە مەعنای گوشادیان بۆ داناون، خستویانەتە بەر چەند قاعیدەو بناغەیەك وەك ئیمامی فەخری ڕازی وای کردووە خوای لێ ڕازی بێ.

بەڵام هەندێکیان تەفسیری ئەم کەلیمانەیان بەشێوەیەکی واقیعی کردوەتەوە وەك من نوسیمەو فەرمویانە ئەم ئایەتە هەمو شتێکی گرتوەتەوە لەچاكو لە خراپ، مەسەلا فەرمویانە هەرچی (واجب) پێویست بێ لە حەقی خوداو حەقی ئینسان خۆیو حەقی خەڵك چ لەبیرو باوەڕ و چ لە صیفاتی نەفسیو چ لە ئیشو کاری دەرەکیدا وەکو شایەتیمانو نوێژو ڕۆژو زەکاتو حەجو غەزاو، مامەڵەو نیکاحو نەزرو وێنەی ئەمانە، هەموی بەر وشەی (عەدل) ئەکەوێ، چونکە هەرکەسێ قوصور لەم شتانەدا بکا ئەوە هاتوە ئیشی بەلای خۆیا و لە حەقی خواو حەقی خەڵك دور کەوتۆتەوە. هەرچی ئیشی (سوننەت) یش بێ، نەفسی بێ یا ماددیو لە عیبادەتا بی یا لە کاروباری خێزانیو کۆمەڵایەتیدا یا وەك خۆشویستنی ڕەهبەرانی بەهرەمەند یا خەرج کردنی دارایی یا چاوپۆشی کردن لە خەڵك هەموی بەر وشەی (احسان) ئەکەوێ. لێرەدا دیارە حەقی خزمو خوێشیش هەر بەر (احسان) ئەکەوێ، بەڵام لەبەر ئەوە کە خوا زۆر بەبایەخەوە تەماشای کردوە، بەتایبەتی ناوی هێناوە. هەرچی گوناهو تاوانیش بێ، ئەوەی بە زمان بکرێ بەر (فحشا و) ئەکەوێو ئەوەی بەئەندامەکانی تری لەش بکرێ بەر (منکر) ئەکەوێو، هەرچییشی لە هەرە نابارو خراپەکان بێ چ لەگەڵ خەڵکدا بیو چ لە خۆدا هەموی بەر (بغی) ئەکەوێ. بۆیە ئەمەم نوسییەوە بۆ ئەوەی بەرچاوی خوێندەوارانی بەڕێز ڕوناك بێ.

ڕۆڵەم! مامۆستا بە دڵێکی پاك
دەرست پێ ئەڵێ وەکو برای چاك
پێت ئەڵێ خودای سەرانسەر جیهان
نیعمەت ئەڕژێنێ ئاشکراو پەنهان
میهرەبان لەگەڵ هەمو گیان لەبەر
بەتایبەت لەگەڵ نەتەوەی بەشەر
فەرمانی داوە بە (عەدل)و (ئیحسان)
بە کەرەم لەگەڵ کۆمەڵی خوێشان
نەهیی کردوە لە (فحشا) و (منکر)
لە (بغی)ییش هەتا ژین ئەبەینەسەر
جا من ئەمانە بەیان ئەکەم بۆت
هەتا تێ بگەی مەعنای دەرسی خۆت

(عەدل) بەمەعنا میانە کاری
لە واجباتا بەوەزعی جاری
لە ئیعتیقادا لە بیروباوەڕ
لە واجباتی ئەحکامی بەشەر
لە حەقی عالەم لە دادگا
مویێ لانەدا بەم لاو بەولادا
زنجیرەی ئەمە زۆری پێ ئەچێ
تا پیاو تەواوی سەری لێ دەرچێ
(احسان) پێویستە لەوەی سونتەت بێ
کە مایەی خێرو چاکەو ڕەحمەت بێ
لە عیباداتا لەسەر شێوەی دین
لەگەڵ کەسو کار بۆ پێویستی ژین
بەتایبەت ئیحسان بۆ خزمو خوێشان
لەوانا چاتر لەبۆ دڵ ڕێشان
هەمو ئەمانە مایەی ئەمانن
مایەی قایمی دینو ئیمانن

(فحشاء) وتاری کە ناپەسەندە
بە شەرعی خوداو بەعەقڵی بەندە
(منکر) هەر کاری تاوانباری بێ
خوا چ نهێنی یاخود دیاری بێ
(بغی) بەمەعنا سەرکێشی ئینسان
بەرامبەر بە (عەدل) ڕوبەڕوی (احسان)
خود پەرس هەرچەند پایە بڵند بێ
ئەبێ ئاخری ڕۆژێ بە پەند بێ

ئەم صیفەتانە خاوەن ئاثارن
لە خێرو شەڕا زۆر مایەدارن
عەدل ستونی چەرخی بێ ستون
عەدالەت نەما دایێ سەرنگون
وا لەسەر عەدلی نیظامی قودسی
دەوری دائیرەی مەجموعەی شەمسی
کاتێ تەوازن لەبەینا نەما
زەوی ڕۆئەچێو ئەڕوخێ سەما
بە عەدالە ڕێکی دوو کەس لە ژینا

له ئیشی دنیاو له ئیشی دینا
به عەدلە یاسای ژیوارو ژیان عەدل بۆ سودەو ستەم بۆ زیان
به هێزی عەدله بیزانه یەقین
ئەڵێن گورگ و مەڕ پێکەوه ئەژین
کاتێ هاته ناو عەدالەت کاری
بەشەر روئەکا بۆ بەختیاری
بۆ زانست و فەن له بۆ دارایی
بۆ تەن دروستی و جیهان ئارایی
له پاش عەدالەت فەضیلەی ئینسان
حەصره له خولقی پیاوانەی ئیحسان
ئیحسان وەسیلەی شانه لای خودا
پایەو مایەیه بۆ سەرو سەودا
ئەوەی بەڕاستی ناوی ئینسانه
ئەزانێ ئینسان بەندەی ئیحسانه
ئینسان به ئیحسان دێوان ڕام ئەکا
دڕندەی کێوان دڵ ئارام ئەکا
دوژمنی دژ حاڵ ئەکا به برا
برای بێ کەماڵ ئەکا به چرا
بەتایبەت ئیحسان لەگەڵ خزمانا
خوا فەرمویەتی لەناو قورئانا
(نامی) ئەوەیه به ئەمری قورئان
بژی تا بمرێ بەدین و ئیمان

ئەو عەیبەی خودا ناوی نا (فحشاو)
ئینسان دائەنێ له ڕیزی وەحشا
زمانی پیسه، زمان پیسەکان
ژار فڕێ ئەدەن بە وێنەی ماران
کوفرو بوختان و خوڵقی عەیب و عار
جنێو و تانەو توانجی نابار
فیتنەو ئاشوبەو هەروا نان بڕین
قسەی زیان بەخش بۆ دنیا یا دین
هەمو ئەمانه بەری زمانن
دوژمنی خۆشی بەرەی ئینسانن
ناوی (منکر)ەو لەگەورە تاوان
غەصب و ئیستبلای ماڵی داماوان
درزی جەردەیی و ئیعدامی نوفوس
هەم داوێن پیسی و لادان له ناموس
(بغی) یاخی بون لەهۆی حەق ناس
له بایی بوونه بۆ ناسوپاس
نیرو دەمارو مل له حەق لادان
بۆحەیوان ئەشێ نەوەك بۆ ئینسان
بۆ ئیبلیس ئەشێ کەوا شەیتانه
خودا لامان دا لەم تاوانانه
دەرسی مامۆستات عەدل و ئیحسانه
مایەی خۆشی ژین، بەهرەی ئیمانه



# دیوانی مەحوی‌و
# کاری تازەی مامۆستا مەلاکەریم

حەسەنی قزلجی

شاعیرێکی فارس گوتەنی: ((هەر تاویٚ لەم باخە بەریٚ پیٚ دەگا، تازەترو تازەتریٚ پیٚ‌دەگا. بەلیٚ بنەماڵەی تێکستۆلۆگی کوردی باخەو، باخێکی زەنوێرو پڕ لە بەر. بەری سالانی پێشووی ئەم باخە زەنوێرەمان دەس کەوت‌و تام‌و لەزەتیمان چێشت. پیری تەمەن پیرۆزو لاوی بەتین‌و تاوی زانیاری‌و ئەدەب مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس هەوەڵێن نەمامی باخی تێکستۆلۆگیی ئەدەبی کوردی بە ڕێکوپێك کردن‌و لێکۆڵینەوەی دیوانی شای شاعیرانی کورد (مەولەوی) ناشت. پاشان وەکو بنەماڵەیەکی وەجاخ ڕوون کوڕەکانی پیٚ گەیشتن‌و لە ژێر چاوەدێریی باوکیاندا فێربوون‌و کەوتنە یارمەتی دانی. ئەمجار بە هەرەوەزو. بەڕێنوێنی مامۆستا مەلا کەریم بەری تازەیان لەو باخە پیٚ‌گەیاند. (دیوانی نالی) شیرین‌و خوسرەو)ی (خانای قوبادی)یان ڕازاندەوە. ئێستا بەری تازەتر پیٚ گەیشتووە کە دیوانی (مەحوی)یە.

پیت‌و بەرەکەتی تەمەنی پیرۆزی مامۆستا مەلا کەریم. جگە لەکارە بەنرخەکانی، ئەوەشە کە کوڕەکانی وا ڕاهێناوە بە ڕێگای ڕاست‌و ڕەوانی خۆیدا بڕۆن‌و خێر بۆ زمان‌و ئەدەبەکەمان بدەنەوە.

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس هەروەکو هەوەڵێن تێکستۆلۆگی کوردی‌یە. هەوەڵین مامۆستاو داهێنەری کاری بە (کۆلێکتیڤ) یشە لەمەیدانی ئەدەبی کوردیدا. لەگەڵ کوڕەکانی بە (گورووپ)و دەستە کاری کردووەو. فێری کاری بە گۆلێکتیڤی کردوون کە لە دنیای پێشکەوتوودا باوەو دوو یا چەند کەس بەیەکەوە کتێبێك دەنووسن یا وەردەگێڕن. یا کارێکی تری ئەدەبی‌و هونەری‌و زانیاری دەکەن.

چاوەڕوانی دەکرا ئەدیب‌و نووسەرو لێکۆڵەرەوەی دیکە، کاری تێکستۆلۆگی لە مامۆستا فێربن. بە ڕێگەی ئەودا بڕۆن. پرس‌و ڕای پی بکەن‌و لە شارەزایی‌وتەجرەبەی زۆر بەنرخی ئەو بەهرە وەربگرن. بەڵام بەداخەوە تا ئێستا ئەمە نەکراوە. یەك دوو جار لاسایی‌یەکی ئەو کراوەتەوە. بەڵام نەگەیشتووەتە ڕادەی پەسەند!

ئەوا دیوانی مەحوی بە جوانی‌و ڕێکو پێکی لە چاپخانەی (کۆڕی زانیاری کورد) چاپ کراوەو لە بایەخی چاپەمەنی کوردی‌و چاپخانەی کۆڕی زانیاری زیاد دەکا. وەکو لە لاپەڕەی (8–9)ی کتێبەکەدا هاتووە لە ساڵی 1960 ەوە تا ساڵی 1977 چەند ئەدیب‌و لیٚ زان، تاك تاك‌و جووت جووت‌و، بە دەستە خەریکی کۆکردنەوەو نووسینەوەی ئەم دیوانەو، بیروڕا دەربڕین لە بارەی شیعرەکانی دیوانەکە بوون. لێرەشدا لەگەڵ ڕێزو قەدرزانینی کاری ئەوانی دیکە (کە لەو جێگەیەدا ناویان هاتووەو پێویست بە دووپات کردنەوە نی‌یە، بیٚ گومان بەلای ئەوانیش مامۆستا مەلا کەریم دیسان شاسواری مەیدانە، چونکە دیوانەکە پڕە لە زاراوەی سۆفیگەری‌و فەلسەفەی ئیسلامی‌و ئیشارە بۆ ئایەتی قورئان‌و حەدیثی پێغەمبەر کە زانایەکی پایەبەرزی ئایینی‌و بەرچاو بەرین‌و فرەوانی وەك مامۆستا مەلا کەریم نەبیٚ، دژوارە ئەوانەی بۆ بچێتە سەر یەك و ئەو مەتەڵە قورسانەی لەو شیعرانەدا هاتوون هەڵێنیٚ.

سەرچاوە:

ڕۆژنامەی پاشکۆی عێراق ژمارە (18) ئابی ساڵی 1978.

# وچانێك لەبەردەم بەرهەموو شاکارەکانی
# مەلا عبدالکریمی مدرس دا

کاوە حاجی عەزیز

نالی مەزن دەفەرمویٚ:

بەحری غەزەلم پڕ لەدوڕو گەوهەرە، ئەمما

غەوواصی دەویٚ، یەعنی بەتەعمیقی بزانە

تا بە دەردی ئەو پەندە پڕتانەیە نەچوبن کە گوایا ئێمەی کورد زیندووکوژی مردوو پەرستین،جێی خۆیەتی یەك دوو ووشەی ئەمەکداری بۆ خامە بەبرشتەکەی زانای گەورە و پایەداری گەلەکەمان(مامۆستا مەلا عەبدالکریمی مدرس)بکەینە مەدالیای زێڕو بیکەین بە بەرۆکیدا.هەرچەندە کالاڵە قەد بالآدا نییە و نالی ئاسا،دەریا گەردی وای دەویٚ بزانیٚ بۆ قولآیی داچیٚ و بتوانیٚ‌بچێتە بنی ئاوی لێکدانەوە،نەك دەربارەی هەموو شاکارەکانی چونکە ئەو کارە گرنگە چەندەها تێزی ماجستێرو دکتۆرای گەرەکە. لەبەر ئەوە بە هیچ جۆری‌نکوولی لەوە ناکری کە زانایەکی مەزنە و پەیکەری نەمری سەدان سالی دوارۆژمان بۆ دروست دەکات .

داخی گرانم !ئەکرا بۆ زاتیکی وەك ئەو چەندەها سیمینارو وتوویژو تویژینەوە لەسەر بەرهەمە چاپکراوەکانی ولادانی گەردو توزی ماندویتی لەسەر شاکارەکانی تری، ئەگەرهەرهیچ نەبی کۆریکی ریز لینانی بۆ بگیرایە،دەستە دەستە ئەو قوتابیانەی کە لەخزمەت ئەو دا فیری زانست و زانینی ئیسلامی بوون، نووری ئەو بوو بە مایەی ئاواتگەیشتن و گەورە بوونیان چونکە دلنیام ئەو مەلاو زانا ناودارانەی ئیستای عیراق،بەتایبەتی کوردستان وشاری بەغداد یا راستەوخۆ قوتابی ئەوبوون یان قوتابی ئەون. بۆیە گازاندەو گلەیی ئاراستەیان دەکری‌هەرچەندە مامۆستا چاوەروانی ئەم جۆرەکارانە ناکات و خۆی وتەنی(ئەوەی دەیکەم و دەینووسم تەنها بۆ رەزامەندیی خوای گەورەیە و بەس، خۆزگەبمتوانیایە باشتر خزمەت بەکورد بکەم) بەلی‌ئەمە لە کاتیکدا ئەم قسانەی دەکرد کە زانستیکی ئیسلامی نەمابوو بەچەندەها قوتابی تیا پی بگەیەنی‌و لەهەریەکیکیانا بە چەندەها کتیب دابرژی، سەرەرای نووسین و دانانی چەندەها شاکاری بەنرخ چ بەکوردی، یان بە عەرەبی، یان فارسی،باس و خواسیکی فیکری نەمابوو کە چەندەها تویژینەوەو لیکۆلینەوەی لەسەرتۆمار نەکا،بەنوسینەکانیدا دیارە کە زەمەنی وردو خاش کردوە هیچ کاتیکی بەفیرۆ نەداوە ئایەتیکی قورئان نەماوە کە چەندەها لاپەرەی بە کوردی و عەرەبی لەسەر نە نووسی‌و هۆی دابەزین و(ناسخ و مەنسوخ) هەموو زانستیکی قورئانی خستۆتە دووتویی لیکدانە وەو راڤەکردنی. نازانم! باس لە چ کاریکی ئەم زانا گەورەیە بکەم

ئەگەر سەرجەم نووسینەکانی کۆبکرێتەوە دەبێ ئایا رۆژی چەند لاپەڕەی بەربکەوێت؟ دڵنیام ئەگەر دەریاوانێکی وەك(مەلا عبدالکریمی مدرس)نەبوایە، کێ لەشاکارەکانی نالی و مەحوی و مەولەوی و فەقێ‌قادری هەمەوەند دەگەیشت.کەئەم شاکارانە لە رووی کە لە پووریپەوە هێندە بەرز و بەنرخن هەردەم وەك کێوە سەرکەشەکانی کوردستان پەنجە بۆ خۆر درێژ دەکەن، بەگەورەترین سامانی ئەدەبی نەتەوەی کورد دەژمێردرێن.هەرلەرووی کەلەپوورەوە کێ مەکتووبات و نووسینەکانی (کاك ئەحمەدی شێخی)دەدیت کە داخمان ناچێ بۆ کوردی نووسیوە بەلام بەزمانی فارسی ئەگەر زاتێکی وەك ئەو نەبوایە،هەرگیز کەس نەیدەتوانی خۆی لەقەرەبدایە،هێندەی تر کاك ئەحمەدی شێخی موقەدەس کرد وتاجی کوردانەی نایە سەرسەری بەچوار بەرگی قەوارە گەورەوە کتێبخانەی کوردی پێ‌دەوڵەمەند کردووە.هەر لە بواری کۆکردنەوەو ساخکردنەوەی کەلەپوریەوە، چەند ساڵێ خۆی بە کۆکردنەوەی



ئەو فەتواشەرعیانەی کە زانایانی کورد دەریان کردوون لە چەندەها بواری تایبەتیدا، لە ئاکامدا کارەکەی بە ئەنجام گەیشت و بڕی (1060) لاپەڕی لە قەوارەی سێ بەرگدا و بەزمانی عەرەبی لە ژێر ناوی (جواهر الفتاوی) لە ساڵانی 1969 تا 1971 بڵاوکردوونەتەوە کە بەڕاستی هەر لە توانای ئەو دابووە ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنێت بەمەش لە زۆر ڕووەوە گەورەترین خزمەتی گەلی کوردی کردووەو لە رووی کەلەپوریشەوە ئەو فەتوایانەی لە فەوتان رزگار کردوون لەمەشدا دەردەکەوێ کە زانایانی کورد هیچیان لە زانایانی گەلانی تری موسڵمان کەمتر نییە ئەگەر زیاتر نەبێ.

چونکە فەتوا دەرکردن کارێکی هێندە سانا نییە و چەندەها مەرجی زانستی و توانای زیرەکی و لێهاتووی دەوێت ئەگەر بەسەرجەم نووسینەکانی مامۆستا بچینەوە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە هەردەم مامۆستا هەوڵی ئەوەی داوە کورد بە زمانی خۆی فێری ئایین بێت چی تر لە رێگای ئایینەوە کورد نەکرێ بە عەرەب و فارس و تورك.

وە یەکەم زاناشە کە بەو شێوە تێرو تەسەلە هەوڵ بدا کە کورد بە کوردی ئایین فێر بێت، هەر بەم رێگایەش خزمەت بە نەوەکانی داهاتوو بکات، هەربۆ نموونە لە جیاتی گوڵستان و کتێبە فارسییەکانی تر، ذرە الناصحین، نزهە المجالس، مامۆستا بەهارو گوڵزارو سەرچاوەی ئایین و وتاری هەینی و رێگەی بەهەشت و پەناو سکالاو نوری ئیسلام و نامەی هۆشیارو حەجنامەو مەلوود نامەو چەندەها کتێب و نامیلکەی پڕ سوودی تری داناون کە هەر هەموویان پڕ بایەخی مامۆستا مەلا عبدولکەریم دەردەخەن، وە دەیسەلمێنن کە چەند دڵسۆزی هاونیشتمانی و هاوڕەگەزی خۆیەتی، بانگەشەی ئەوە دەکات کە فێربوونی ئیسلام و داب و نەریتی ئایینی و ئامۆژگاریکردنیش ئەگەر بە کوردی بن هیچ تاوانێك بەرپاناکەن، چجای لە رووی فێر کردنیشەوە گوناە نییە هەر لەم بوارەشدا لە جیاتی ئەوەی فەقێ و موستەعیدەکانی حوجرەکانی کوردستان خۆیان بەفتح القریب و دەستەواژە قورسەکانی مغنی المحاج و کتێبە شەرعییەکانی ترەوە کە گومان لەوەدانییە زۆر قورس و گرانن خەریك بکەن، مامۆستای پایە بەرز شەریعەتی ئیسلامی بە چوار بەرگەوەکردە کوردی، ودڵنیام کە جێگای کتێبە عەرەبییەکانی دەگرێتەوەو گەلێکیش لەوان روون و ئاشکراترەو بێ چورتم نەك تەنها فەقێ موستەعیدەکانی لێی تێدەگەن بگرە سەرجەم خوێنەرانیش لێی حاڵی دەبن. بوو بەبەردی بناغەی هەموو لێکۆڵینەوەو وتوێژینەوەی شەریعەت بەپێی رێبازی ئیمامی شافعی (خ.ل). هەر لە رووی کاری کەلەپوورو سامانی نەتەوایەتی کوردەوە هەوڵە پرشکۆکانی هەمیشە وەك مانگی چواردە، دەدرەوشێنەوەو خوێنەرانی کورد پڕ بەبایەخ و ئەمەکداری سەیری ئەو هەوڵانەی مامۆستا دەکەن چونکە هەر لە توانای عەقڵ و هزرو خامەی پڕ بەبرشتی ئەوە بکەوێتە ساخکردنەوەو توێژینەوەی چەندەها دەستنووسی زانایانی کورد، هەر زێرنگەرێکی وەك ئەوە کە بتوانێ ئەو گەوهەرو زێڕەی لە دڵی کەڵە زانایەکی وەك (مەولەوی)دا دەربکات و خوێنەوارانی کوردو عەرەب و فارس پێ خۆشنوود بکات ئەویش ئەم شاکارانەن:

1–عقیدەی مرضیة 868 لاپەڕەیە بە کوردی.

2–الوسیلە فی شرح الفضیلة 830 لاپەڕەیە بە عەرەبی.

3–فوائد فوائح درشرح منظومة فوائح 400 لاپەڕەیە بە فارسی.

هەرهەموشیان دەربارەی عەقیدەی ئیسلامی دەدوێن بە شێوەی راست و دروست و فەلسەفیەوە ماوە ئەوە بڵێم کوردوستانێکی خێر نەدیوی چواربەش کراو، وەلێ بەچەندەها زاناو پیاوچاکی وای تیا هەڵکەوتوون کەبوونەتە سەرمەشقی باشەو چاکە بۆ نەوەی دواترو هەمیشە لوتکەی خێرو چاکە خوازی ناو کۆمەڵ بوون نەك هەربۆ کورد بگرە بۆ عەرەب و فارس و تورکیش، لەوباوەڕەدام ئەگەر هیمەتی مامۆستا نەبوایە ئەوا وەك چەندەها ناسنامەو کەلەپووری مۆرکی نەتەوەی کورد لە ئاسۆی گەلەکەماندا ون و بزر دەبوون بۆیە دانانی چەند کتێبێکی بەکەڵك کە مایەی شانازین بۆ گەلی کوردو

سەرچاوەیەکی سوودمەندن بۆ مێژووی کورد کە ئەوانیش بریتین لە مانەی لای خوارەوە:

1–یادی مەردان بەقەوارەی دووبەرگی ئەستوورەوە خۆی لە 1323لاپەڕە دەدات، وە باس‌و خواسێکی تێرو تەسەلی لەسەر ڕێبازو هەڵسوکەوتی شێخانی نەقشبەندی و سلووکی مریدەکانی تۆمارکردووە، سەرەڕای ژیان‌و بەسەرهاتی شێخانی تەوێڵەو بیارە.

2–بنامەڵەی زانیاران: 630 لاپەڕەیە تەرخان کراوە بۆ چەندەها بنەماڵەی بەڕێزوخاوەن فەزڵ‌و چاکەخوازو دڵسۆز بۆ نەتەوەی کورد.

3–علماؤنا فی خدمه العلم والدین: 866 لاپەڕەیەوە بەزمانی عەرەبی، ئەم کتێبە ناوازەیە باسی گەلێك لە زانایانی کورد دەکات کە خزمەتی ئایینی ئیسلامیان کردووە لە جیهاندا ئیتر ئایا بەوانە بێژی بێت یان بە نووسین.

ماموستا مەلا عبدالکریم خۆشی بەچەند دەستنوسی زانا بەرزەکانی ئیسلامەوە خەریك کردووەو لێکۆڵێنەوەشی لەسەر کردوون‌و وەك:

1–المواهیب الحمیده فی نظم الفریده. دووبەرگە لە دانراوی (ئیمام سیوطي)یە باسی زانستی ڕێزمانی عەرەبی دەکات (نحو صرف).

2–صفوه اللالی من مستصغی الامام الغزالی: باسی زانستی ئصولی فقیه دەکات، بریتیە لە (522) لاپەڕە. وەجێگای باسە ئەم زاتە چەندەها دانراوی بە زمانی عەرەبی هەن بۆ نمونە (1) رسائل العرفان فی الصرف والنحو والوضع والبیان 220 لاپەڕەیە. (2) رسائل فی المنطق والحکمه 283 لاپەڕە.

(3)جواهر الکلام فی عقائد اهل الاسلام (270) لاپەڕەیە وەچەندەها نامیلکەی تری وەك فهم الاسلام–نور الاسلام– رساله ارشاد الناسك الی المناسك نور الایمان.. هتد. حەز دەکەم لە کۆتایی باسەکەمدا بە شیعرێکی شاعیرێکی کورد(2) کۆتایی بەباسەکەم بهێنم کە دەڵێ.

بەڵگەیە بۆ ڕۆژی ڕوون تیشکی هەتاو  
بۆ پەسەندی گوڵ بەسە بۆنی گولاو

هەر ئەوەندە دەڵێم بەسە بۆ گەورەیی ماموستا مەلا عبدالکریم کە تەفسیری هەر (30) جزمی قورئانی پیرۆزی بە زمانی کوردی‌و عەرەبی کردووە ئەویش بەم جۆرە.

1–تەفسیری نامی(3) کە حەوت بەرگەو لە قەوارەی (3778) لاپەڕەی گەورەدایە.

2–مواهیب الرحمن فی تفسیر القران بە عەرەبی ئەمیش هەر حەوت بەرگەو خۆی لە (3292) لاپەڕە دەدات. وە هەردوو تەفسیرەکەش لە یەکتر جیاوازن‌و بەهیچ شێوەیەك ڕێبازو ئامانجیان نەگرتووە یان ڕاستر بڵێین هیچیان، وەرگێڕدراوی ئەوی تریان نییەلە کۆتاییدا عەرەب واتەنی (مالایدرك کلە لایترك کلە) ئەگەر هەندێ نووسینی ماموستام بیر چووبن ئەوە هیچ لە گەورەیی ئەو کەم ناکاتەوە، بۆیە دەڵێم خەرمان بەرەکەت. خێرو بەرکەت.



**پەراوێز:**

1–لە زمانی خۆیەوە لە مەنزڵگای حەزرەتی شێخ عبدالقادری گەیلانی لە شاری بەغداد (جێگای تایبەتی خۆی) بیستومە.

2–شیعری هەژار موکریانی‌یە.

3–نامی: نازناوی هۆنراوەی ماموستا (مەلا عبدالکریمی مدرس)ە بە واتای (ناودار، نامدار)ە.


سەرچاوە:

کەلەپووری کورد

گۆڤارێکی کەلەپووری‌و فۆلکلۆری وەرزییە کۆمەڵەی کەلەپوورو فۆلکلۆری کورد لە سلێمانی دەریدەکات.

ژمارە (11) ئەیلوولی 1997ل 136–143

# تیشکێك بۆسەر
# دیوانی مەحوی

نووسینی : عمر معروف برزنجی

هەموو بیر کردنەوەیەك بە مەبەستی بوژاندنەوەی سامان وکەلەپووری نەتەوایەتی و گەڕان و پشکنین لە ڕێی بژارو ساخ کردنەوەو بەرچاوخستنیاندا کارێکی تا بڵێی سەنگین و بەهادارەو جێبە جێکردنیشی ئەرکێکی گرانی شارەزایانی ئەم بەشەیە، لەم بارەیەوە بنەماڵەی زانای ئاییینی (مەلا عەبدولکەریمی مدرس)و چەند پسپۆڕێکی تر جێ دەستیان دیارەو گەلێ تێکستی شاعیرە بەهرەمەندەکانی کوردیان ڕاست کردووەتەوەو لە ئەنجامی ماندو بوون و تاوتوو کردنی چەندەها دەستنووس و پەرەکاغەزی پوواودا ڕاستییان هەڵێنجاندووە. دوا بەرهەمیش کە لە خانەی ئەدەبی کلاسیدا جێی تایبەتی بۆ تەرخان کراوە کۆکردنەوەو لێکدانەوەی شیعرەکانی(مەحوی) (1830–1906). جا کارێکی وا بەنرخ و بایەخدار لەگەڵ گرنگی و ڕەنجی لێکۆڵەرەوەکاندا هێشتا ڕێی لە خوێندەواران نەگرتووە کە بەچاوێکی تیژی سەرنجەوە تێی بروانن و تا ڕادەیەکیش تیشکی پێویست بخەنە سەر هەندێ لایەنی. لە پێش هەموو شتێکدا کاك (محەمەدی مەلا کەریم) لە پێشەکیەکەیدا پەلی بۆ رستێك مەسەلەی هونەری و فیکری و هەڵوێستی ڕۆژانەی شاعیر هاویشتووە کە لە ڕاستیدا بۆ زۆربەیان توانیویەتی کە بە وردی و لێکدانەوەیەکی زانستیانەوە بەرەو ڕوویان بچێ و هەندێ تەپوتۆزی ڕۆژگاریان لێ بتەکێنێ و دیوی ڕاستەقینەی شاعیر بۆ نەوەی ئەمڕۆمان دەربخات، بە تایبەتی ئەو بەراوردە ژیرانەی کە لە نێوان (نالی (1800–1856)و مەحوی دا کردوویەتی و پەنجە درێژ کردن بۆ ئاستی بیری نەتەوایەتی و باوەڕبوون بە چەند پڕو پووچێکی ژیان لە شیعرەکانی مەحوی‌داو سەرکەوتنی نالی لەم بوارەدا. بە بەڵگەی پێویستیشەوە نالی وەك لوتکەیەکی هەڵکشاو دەرخستووە کە هیچ شاعیرێکی ئەو قوتابخانەیە نەیتوانیوە کە بەلایدا گوزەر بکات، لەم بارەیشەوە ئەو بۆچوونەی (کاکەی فەللاح)ی هەڵوەشاندووەتەوە کە بەبێ بەڵگە وای نیشانداوە کە مەحوی لە ڕیزی پێشەوەی نالیدا بووە، کە دیارە ئەمەیش ڕایەکی نەزۆك و پەرگرتووی عاتیفەیەکی ڕووتەو لەبەر تیشکی سەرنج و بەراوردەکانی کاك (محەمەد)دا خۆیان بە پێوە ناگرن و ئەتلیسێنەوە، چونکە جیهانی نالی و ئاسۆی بیری و تێڕوانینی بەرامبەر بە ڕۆژگارو دیاردە جیاوازەکانی سرووشت و سەرجەم ئەم گەردوونە بەرینە هێندە فراوان و پەل‌وپۆ دارە کە نوقتەی بەراورد نابینرێت لەگەڵ شاعیرانی ترداو (شیعرەکانی نیشانەو ڕەمزی شیعری هەرە بەرزی سەردەمی خۆی بووە، بۆیە بووە بە ماموستای شیعر. ڕاستیش وایە کە کاکەی فەلاح ڕایەکی هێندە ساردو سڕو بێ بناغە ئەخاتە ڕوو هەروا بە کزۆڵەیی و دەست بەتاڵی بە بێ بەڵگەو نموونە بەجێیان نەهێڵێ.. چونکە مەسەلەیەکی وا گرنگ و هەست پێکراو ئاتاجی بەڵگەیە.



کاك محەمەد لە پێشەکی‌یەکەیدا بەبێ ئەوەی پێویستی‌یەکانی ئەم سەردەمە ناچار بکا زیاد لە جارێك پوورە هەنگی مەسەلەیەکی ئاییینی وروژاندووەو جارێکی تریش کینەی نێوان تەریقەتی قادری و نەقشبەندی زاخاو داوەتەوەو بەبێ پەروایش خۆی لە ڕیزی دووەم داناوەو دارکاری هەڵگرانی تەریقەتی قادری کردووەو بە نمونەو پێشڕەوانی خراپەکاری ناوی بردوون. کە وابزانم سەرەتاتکێ کردن لەگەڵ مەسەلەیەکی وا چڕو ئاڵۆزو بەیەکا چووی ئەم ڕێبازانە بەچەند سەرنجێکی سەرپێ‌یی و ساکار مرۆڤ ناگەیەنێتە ئەو پەڕی مەبەست و لە توانیدا نی‌یە کە سەرجەم پەل بهاوێژێ بۆ کرۆکی بیروراو هەڵوێستی ڕۆژنەیان، بە نووکە قەڵەمێکی درشتیش یەکێك بە بەدکارو ئەوی تر بە فریشتەو پەپوولەی سەر زەمین دەستنیشان ناکرێت، نەخوازەڵا بۆ یەکێکی وەك ماموستا موحەمەد کە گۆشکراوی باوەڕێکی پێشکەوتن خوازانەیەو لە بەرژەوەندی کێیە کە لەم ژیانە جەنجاڵ و بەیەکا چووەدا بەرگری لە مەسەلەیەکی دەروێشی بکاو باس کردن و پیا هەڵدانی هەر کامێکیان چ سوودێك ئەگەیەنێ بە نەوەی ئەمڕۆو لەوە بەریش چی‌یان کردووە بۆ نەتەوەکەیان؟ بەلای منەوە ئەم دوو ڕێرەوە لە ڕۆژگارێکدا چەکەرەیان دەکردو پەلیان هاویشت کە ئاستی لێکدانەوەو ئاسۆی بیر بە کزی ئەبینراو تێکڕا وڵات بالی دواکەوتن و نەهامەتی بەسەردا کێشرابوو. وەك کاك

محەمەدیش ئەڵێ کە (هەوڵی زۆرو بە تینی عوسمانی‌یەکانیش  بۆ سڕ کردنی مێشك و بیری خەڵك و هەڵخەڵەتاندن و خلافاندیان  لە ڕێگای پشتیوانی کردنی بیری سۆفیەتی دەروێشی‌یەوە کە لەو هەموو  دەسگرۆیی کردنەی شێخەکان و تەکیەو خانەقا بۆ کردنەوەو  مووچەو مانگانە بۆ بڕینەوەیاندا دیاری ئەدا)[4] لەگەڵ ئەمانەیشدا هەڵگرانی ئەم  ڕێبازانە لە کەسانی دڵسۆزو ڕەوشت بەرزو دەروون پاك بەدەرنین بەلام هەردوولا  ئەگەڕێنەوە بۆ یەك سەرچاوە کە بریتی بووە لە کۆمەڵ گردکردنەوەو خۆش خۆری و نیشتەجێ بوون لە سایەی سێبەردا، بە تایبەتی لەسەر دەمی مەحویدا ئەم مل ملانێیە تینی سەند، شیعرەکانی مەحوی دژی قادریەکان و ڕاوەدونانی مەحوی و کەسانی تر لە لایەن قادری‌یەکانەوە هەموویان گرێ درابوون بە تاڵێکی گرژی تایبەتی کە هەر بەرەیەکیان ئەیان ویست تەنها خانەقاکەی خۆیان بناسرێت و پشت بکرێتە شوێنانی ترو ڕاکێشانی هەستی ئەو  ساویلکانەی کە لە ناوچە جۆرە بە جۆرەکانی کوردستانەوە بە دیاری و هیزە ڕۆنەوە ڕوویان لە سلێمانی




ئەکرد. نووسەر لە لایەکی تری پێشەکی‌یەکەی‌دا دەربارەی مەحوی ئەڵێ (سەرەڕای بەهرەی شاعیری‌یەتی‌یەکەی خاوەن نەفسێکی یاخی شۆڕشگێڕو دەروونێکی سەرکەش بووەو لە سلێمانیشدا ژیاوە کە مەیدانی ئەو هەموو ناکۆکی و زۆرانبازی‌یەی نێوان حەق و ناحەق و زوڵم و دادبووە) ڕاستە شاعیر زۆرجار قسەو ڕەفتاری کەسانی تری بۆ قووت نەچووەو بەبێ ترس بەرەنگاری کردوون و ئازایانە دەردە دڵی خۆی هەڵڕشتووە، بەلام لەگەڵ ئەمانەیشدا لە دوو توێی شیعرەکانی‌دا هەندێ جار بەرزو نزمی لە هەڵوێستی‌دا ئەبینرێ و شتی بچووك گەورە کراوەو لەبەردەم زوڵمی گەورەدا چاو نوقێنراوە، ئەگینا  لە کاتێکدا شاعیر شالاو ئەباتە سەر قادری‌یەکان و تاوانباریان ئەکا بەوەی کە کردەوەکانیان سوودی دنیایی تیایەو دەرچوونە لە ڕێڕەوی ئایین نەئەبوو بەهەمان شێوە ئەم شالاوە بەرەو ژوورتریشی بگرتایەوە؟ تۆ بڵێی (سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی) لە ژێر پەردەی ئایینیدا ڕاوی بیری دروستی نەکردبێ و دەستی بە ئایینەوە گرتبێ، ئەی بۆ شاعیر پارچە شیعرێکی ناوازەی بۆ تەرخان کردووەو چەپڵەی سەرکەوتنی بۆ لێداوە لەبەر ڕووە ئایینی‌یەکەی، ئەی خۆ تەریقەتی قادریش بە هەمان شێوە خۆیان بە پێشڕەوی ڕێبازێکی گونجاو زانیوەو بە پیرانیشیان جێی متمانەو بڕوای زۆبەی جەماوەری کوردبوون لەو کاتەدا بۆ لە پلار تێگرتندا سڵی نەکردووەوتەوە یان بەرژەوەندی‌یە تایبەتی‌یەکە وەك ئاووشیر تێکەڵ بە بیرکردنەوەی بووەو کردنەوەی خانەقایەك لە لایەن سوڵتانەوە ئیلهامی ئەو شیعرەی پێ بەخشیوە. کاك محەمەد وای لێکداوەتەوە کە مەحوی ڕەنگە ویستبێتی لە پاڵپشت گرتنی  ئەمانەدا بەسەر دوژمنانی شارەکەی‌دا زاڵ بێ، بەلام گەر مەسەلەکە وابێ و بۆچوونەکەی نووسەر بسەلمێنین ئەوا نەمەیین و خۆ نەگرتنی مانای هەڵوێستە لە بیری شاعیرداو  ستایشی زوڵمی گەورەیە بۆ لێدانی زوڵمی بچوکترو هەر ئەبێ بگەڕێینەوە بۆ مەسەلە تایبەتی‌یەکە کە بریتی یە لەوەی لەو کاتەدا (خانەقایەکیان) لە سلێمانی  بۆ کردوەتەوە ئەوەتا ئێستا بە خانەقای مەحوی بەناوبانگە، مەعاشێکیشی  بەناوی خزمەت کردنی هەژارانەوە بۆ بڕیوەتەوە. یان وەك نووسەر دەری خستووە کە شاعیر ستایشی  (حەمە عەلی قاجاری)  کردووە کە پێشڕەوی فەرمانڕەوا ستەمکارەکانی ئێران بووەو چاوی چەندەها خاوەن بیری ئازادی هەڵکۆڵیوەو زەبروزەنگی هەموو کوچەیەکی گرتووەتەوە.

لێکۆڵەرەوەکان لەگەڵ ئەو کۆشش و ڕەنجەی کە داویانە لە پێناوی سەرکەوتنی کارەکەیاندا بەلام لە هەندێك لایەنەوە تووشی ئاڵۆزی و لێکدانەوەی دژ بەیەك و وشە ترجاندن و دووبارەکردنەوەی ناپێویست بوون بۆ وێنە لە (ل11)دا بۆ وشەی (بەکول) وایان داناوە کە واتاکەی بە (تەواوی)یە کەچی هەر لە پەنا ئەم وشەیەدا بۆ وشەی (بە کوللی) نووسراوە (بەیەکجاری) کە ئایا جیاوازی نێوان (تەواوی)و (یەکجاری) چین، ئایا وشەیەکیان لە چەند شوێنێکدا مانا لێکداوەتەوە کە پێویست نین و زیادە  ڕۆیی و قەبە کردنە وەك لە (ل31)دا وشەی (ئیما) بە  ئیشارەت لێکداوەتەوە کەچی لە (ل35–213)دا چەند جارێکی تر نووسراوەتەوە. لە (ل31)دا بۆ وشەی (طەریقەت) وتراوە (ڕێگە  صوفیەیان بۆ خواناسی) (طەریقەت)  واتا (ڕێگا) لە (ل8)دا  بۆ (مەنصوری حەللاج) چەند دێڕێك نووسراوە کەچی لە (ل34)دا جارێکی تریش دووبارەکراوەتەوە، نەك هەر ئەمانە بەڵکو لە لاپەڕەکانی  (35–39–152) واتای ئافتاب لێکدراوەتەوە  بە خۆر. لە (ل203) دا بەسێ دێڕ دەربارەی  (ئەسفەندیار) زانیاری یان بە دەستەوە داوە ... بەهەمان شێوەش لە لاپەڕەکانی (203–235) دا نووسراوەتەوە، لە (ل193)دا مێژووی ئەفلاتون خراوەتەوەڕوو بۆ جاری دووەمیش لە (ل246) دا باس کراوەتەوە، لە لایەکی ترەوە خۆیان خەریك کردووە بە لێکدانەوەی هەندێ وشە کە پێویست  نین وەك لە (ل50) بۆ وشەی (کوکب) (ئەستێرە) نووسراوە. (ل128) وشەی (نار) بە (ئاگر) لە (ل237)دا (شمس) بە (ڕۆژ) یا وشەیەکیان لە دوو شوێندا بەچەند مانایەکی جیاواز لێکداوەتەوە وەك لە لاپەڕەکانی (86،95،184) دا وشەی (جیلوە) یان بە (دەرکەوتن) لێکداوەتە کەچی لە (ل139دا) وتویانە (جیلوە) واتا  تیشکدانەوە، بۆ ئەم وشەیە گەڕامەوە بۆ دیوانی نالی (10) کە مامۆستایان (مەلا عەبدولکەریمی مودەریس)و (فاتیح عەبدولکەریم)و (محەمەدی مەلا کەریم) ئامادەیان کردووە ڕێکیان خستووە بۆم دەرکەوت کە لە (ل75)دا وشەی (جیلوە)یان بە ڕوناکی نیشانداوە.

لێکۆڵەرەوەکان لە هەندێ شیعردا هاتوون کە چەند  وشەیەکیان گۆڕیوەو کوردی یەکەیان نووسیوەو وەك لە (ل335)دا شیعری (شێخێك هەمەوەندێکی ئەدا وەعظ و نەصیحەت) وشەی (وەعظ) کراوە بە (پەند) کە هەڵەیەو لە چەندان دەستنووسی کۆندا کە ئێستا لەبەردەستان (وەعظ) تۆمارکراوە، عەلائەدین سەجادی‌یش لەکاتی خۆیدا لە  کتێبی (مێژووی)ی ئەدەبی کوردی هەرهەمان وشەی (وەعض)ی بەکارهێناوە، بۆ زیاتر بەراوردیش گەڕامەوە بۆ

چاپی یەکەمی دیوانی مەحوی کە ساڵی 1992چاپکراوە بۆم دەرکەوت کە لە (ل73) دا نووسراوە (وەعظ) لە لایەکی ترەوە ئەبوایە مامۆستایان لەوە ئاگاداربوونایە کە ئەم وشەیە لە زۆربەی شیعرەکانی (مەحوی)دا هاتوونەتە کۆڕیّو دیاردەیەکی تازە کوورەنی‌یە بە نیسبەت سەرجەم شیعرەکانی‌یەوە. لە (ل93)دا بۆ شیعرەکەی (گۆران 1904–1962/11/18) کە ئەڵێ (بەڵێ دیارە لەناو قەومی بەسیتا قەدری سنعەتکار، وەکو عەکسی قەمەر وایە لەناو حەوزێکی لیخندا) هەڵکێشراوەو کراوە بە وەکوو عەکسی قەمەر وایە لەناو ئاوێکی لیخندا لێرەدا نازانم وشەی (حەوز) بۆ کراوە بە (ئاو) لێکۆڵەرەوەکان لە (ل550) دەربارەی ئەو شاعیرو نووسەرانەی کە لەسەر مەحوی‌یان نووسیوە هاتوونەتە سەر شێخ ئەحمەدی شێخ غەنی (فەوزی)و (13) و تویانە کە شاعیر بە بۆنەی دەرچوونی دیوانی (حەمدی 1876–1936) یەوە چەند بەیتێکی بۆ وتووەو بە شانو باڵی مەحویشیدا هەڵداوە، دواییش شیعرەکەی (فەوزی)یان بە کەچو خواری‌و دەستکاری بڵاوکردۆتەوە، جارێ پێش هەموو شتێك فەوزی ئەم شیعرەی بە بۆنەی دەرچوونی دیوانەکەی حەمدی یەوە نی‌یە، بەڵکو پێش ئەوەی بیر لە چاپدانی شیعرەکانی بکرێتەوە ئەم شیعرە لە لایەن فەوزی‌یەو دانراوە، لە کاتێکیشدا کە بنەماڵەی حەمدی داوایان لە خوالێخۆشبوو



(مامۆستا نجم الدین مەلا 1898–1962) کرد بۆ نووسینەوەی نوسخەیەکی تەواوی شیعرەکانی... ناوبراویش لە ماوەیەکی کەمدا ئامادەی کردو بە پێویستیشی زانی کە ئەو شیعرەی (فەوزی) بخاتە ناو دیوانەکەوە تا لە گەڵیدا چاپ بکرێت بەڵام لە کاتی چاپ کردندا لەبەر هەر هۆیەك بوو لە دیوانەکە دەرهاوێژراوە،لەم بارەیەشەوە مامۆستا نجم الدین مەلا گلەیی‌یەکی توندو تیژی بە بۆنەی دەرچوونی دیوانەکەوە لە ڕۆژنامەی ژین دا بڵاوکردووەتەوە بە ناونیشانی (سکاڵایەك)و پەنجەیشی بۆ شیعرەکە درێژ کردووەو بەرێکیش خستویەتی‌یە سەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی ناوبراو، لەلایەکی ترەوە لێکۆڵەرەوەکان شیعرەکەی (فەوزی)یان دەستکاری کردووە، لە دێڕی یەکەمدا وشەی (صاحب) یان گۆڕیوە بە (خاوەن) لە دێڕی دووەمیشدا وشەی (گۆچان)ی کوردی‌یان کردووە بە (چوگان)ی فارسی لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم شیعرە جگە لەوەی کە لە چەند دەستنووسێکدا تۆمار کراوە.. بۆ یەکەم جار لە ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە (1374)ی ڕۆژی (1957/12/19) دا بە تەواوی بڵاوکراوەتەوەو ڕاست وابوو کە لێکۆڵەرەوەکان بچوونایەوە سەر ئەو سەرچاوەیەو بە تەواوی بخرایەتە بەرچاو.. بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی وشەی چوگانو گۆچان گەڕامەوە بۆ چەند سەرچاوەیەكو بۆم دەرکەوت کە بەکارهێنانەکەی شاعیر ڕاسترەو مەودایەکی فراوانتری هەیە، بۆ وێنە (فەرهەنگی ئەمیر کەبیر) کە بە فارسی‌یەو لەواتای وشەی (چوگان)دا ئەڵێ:

از ورز شهای باستانی‌و ملی ایران است که نخست از ایران بهندو از انجا به انگلستانو ممالك دیگر اروپا سرایت کرده است. چوگان سواره راروی چمنی از (250تا 300متر) بازی میکنندو در هر دسنه 4 سوار شرکت دارند. بازیکنان بوسیله چوگان دو سر بطول 1.30 متر که قابل تا شدن است گوی (توپ مخصوص) از بطرف دروازه صریف (میرانند)[16] واتا ئەم وشەیە دوورە لە مەبەستی شاعیرو بە زۆری بۆ جۆرە یاری‌یەك بەکاردێت، بەڵام زانای کورد (تۆفیق وەهبی) لە فەرهەنگەکەیدا لە بارەی وشەی (گۆچان)ەوە ئەڵێ[17]:

gochan : staff. crook
pola- stic. Hockey. Stick

کە لێرەدا بۆمان ئاشکرا دەبێت کە ئەم وشەیە فراوانترەو ئەو واتایەش ئەبەخشێ کە مەبەست گۆچانی دەستە، لە هەمان کاتیشدا بۆ یاری هۆکیش بەکاردێت. جا لێرەدا بە کارێکی لە باری ئەزانم کە شیعرەکە بەڕاستی‌و بێ دەستکاری بڵاو بکەمەوە:

گەرچی نالی‌و کوردی‌و سالم لە دەوری ماضی‌یا
صاحیبی دیوانی عالی بوون لە شیعری کوردی‌یا
گۆیی سەبقەت هەر لە ئاوا مابوو مەحوی پێی گەیشت
خستێوە مەیدان بە جێی هێشت لە عەصری ثانی‌یا
دایە بەر گۆچانی تەشبیهو بەلاغەت رای فڕاند
ئەو بەیانو ئیستیعارەی وا لە شیعری حەمدی‌یا

لە بارەی سەرچاوەی ئەم دیوانەوە کارێکی

پێویستە کە پەنجە بۆ لاپەڕە (حەوت)ی کتێبەکە ڕابکێشم کە بۆ مێژووی ژیانی مەحوی و تاری (ناوەندە ئەدەبی‌یەکی ئاڵۆزو ژیانی ئەدەبیمان کراوە بە سەرچاوە کە لەکاتی خۆیدا لە ژمارە (2)ی پاشکۆی عێراقی ڕۆژی 1977/4/21دا بڵاوکراوەتەوە، لە کاتێکدا کە گەڕامەوە سەر ئەو وتارەو بەراوردم کرد لەگەڵ ئەو مێژووەی کە کاك ئەحمەد نووسیویەتی بەزوویی بۆم ئاشکرا بوو کە ناوبراو بەبێ موناسەبەو پێویست قووت کراوەتەوەو یەك (پیت) سوودی لێ وەنەگیراوە چونکە ئەو وتارە خاڵی‌یە لە ساکارترین زانیاری‌و نازانم ناو هێنانی لەم کتێبەدا بۆچی بێ، تۆ بڵێی تەنها مەبەست ڕازی کردنی سەرجەم ئەوانە بێ کە دوورو نزیك پەیوەندی‌یان بە شاعیرەوە هەیە؟ جا گەر وابێ لەم حاڵەتەدا بەکارهێنانو ناوبردنی سەرچاوە نرخی نامێنێ‌و لە فرمانی سەرەکی خۆی ڕووت ئەکرێتەوەو ئەبێتە ئامرازێکی ڕازی کردن نەك ڕێنمایی کردنی نووسەر.

**سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

1–جگە لە بنەماڵەی زانای ناودار (مەلا عەبدولکەریمی مدرس) چەند پسپۆڕێکی تری وەك دکتۆر مارف خەزنەدار لەم مەیانەدا بەرهەمی ڕەنگینیان هەیە.

2–بڕوانە دیوانی مەحوی– لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد– بەغداد 1977.

3–بڕوانە دیوانی نالی فەرهەنگی نالی لێکۆڵێنەوە ساغ کردنەوەی –دکتۆر مارف خەزنەدار– لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی– بەغداد 1977 لاپەڕە (8).

4–بڕوانە پێشەکی دیوانی مەحوی لاپەڕە (14).

5–هەمان سەرچاوە لاپەڕە (11).

6–سوڵتان عەبدولحەمید ماوەی 32 ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە.

7–بڕوانە دیوانی مەحوی (ل–245).

8–هەمان سەرچاوە لاپەڕە (6).

9–بڕوانە دیوانی مەحوی– بەشی فارسی (ل534).

10–بڕوانە دیوانی نالی– لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی (مەلا عەبدولکەریمی مدرس)و فاتیح عەبدولکەریم لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد – بەغداد 1976 (ل75).

11–بڕوانە مێژووی ئەدەبی کوردی– چاپی یەکەم بەغداد 1952)

12–دیوانی مەحوی –چاپی یەکەم– چاپخانەی حکومەت 1922 (ل73).

13–فەوزی ناوی شێخ ئەحمەدی کوڕی حاجی شێخ غەنییە ساڵی (1310)ی کۆچی لە سلێمانی هاتۆتە دنیاوە، ژیانی بە مووچەخۆری میری بەسەر بردووە، گەلێ لە بەرهەمەکانی لەسەردەمی شێخ مەحمودی نەمردا لە ڕۆژنامەکانی بانگی کوردستانو ڕۆژی کودرستاندا بڵاوکراونەتەوە، مامی شاعیری ناو دار (شێخ نوری) (شێخ صالح)ە، لە ڕۆژی (9)ی شوباتی 1958دا لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە، لە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتیدا لە شیعرەکانی ئەکۆڵینەوە. مامۆستا نجم الدين مەلا. بە بۆنەی کۆچی دوایی شاعیرەوە وتویەتی:

گوڵی مەعاریف چووە خاکی تار
گوڵزار خامۆشە بێ نەغمەو هوزار

بۆ ئەم شیعرە بڕوانە ژین ژ 1381 ڕۆژی (1958/2/13)

14–دیوانی حەمدی– چاپخانەی ئەسعەد–بەغداد 1957.

15–بڕوانە ژین ژ (1374 ڕۆژی 1957/12/19، نووسەر ئەم وتارەی بەنازناوی (کامە خول شێخ بزەینی) یەوە بڵاوکردووەتەوەو ناوە ڕاستەقینەکەیم لە کاتی خۆیدا لە مامۆستا نجم الدين مەلا بیستوە کە خۆیەتی....

16–بڕوانە فرهنگ امیر کبیر –تألیف محمد علی خلیلیو علی اصغر شمیم – موسسه مطبوعاتی امیر کبیر –چاپ اول– زمستان سال 1334 شمسی (ل180).

17–بڕوانە : A Kurdish – English Dictionary
by: Taufiq Wahby- C.J. Edmonds
Oxford university press 1966
Printed in great Britain –p55

گۆڤاری
ڕۆشنبیری نوێ
ژ 68 حوزەیرانو تەموز
1978



## عەبدولکەریم ئەلمودەریس
## چرایەکە کە کوژانەوەی نیە



ڕەئوف عوسمان

مامۆستا عەبدولکەریم ئەلمودەریس یەکێکە لە ئەستێرە درەوشاوەکانی ئاسمانی ڕۆشنبیری ئاینیو ڕوناکبیری کورد لەسەردەمی بیستەمدا، ئەم زانا پایە بڵندەمان کۆمەڵێك توخمو هۆکاری کاریگەرو گەورە لە پشت کەسایەتیە دیارو بەرزکەیەوەن، کە دیارترینیان بەهەرەو وزە تایبەتیەکەیە، کە دەکاتە زیرەکیەکی فرەو بیرەوەریەکی تیژو توانایەکی پڕ لە بەخشینو لەبن نەهاتن، ئەمە جگە لەو هەوڵە بەبرشتو درێژ خایەنە هەمیشەییەی کە بێ پسانەوە تا ئەم دواییەش هەر لە گەڕدا بوە، نابێت دوو شتی گرنگ بخرێتە پشت گوێ لە بواری چۆنێتی فۆرمەڵە بوونی ئەم کەسایەتیەدا کە یەکێکیان وانە خوێندنو سوودبینێکی فرەیە لە مامۆستاپایە بڵندەکانی کەدەرسیان پێوتۆتەوە بەتایبەتی بلیمەتێکی وەك شێخ عومەری ئیبن قەرەداخیو دوەمیشیان وانە وتنەوەو موتالای هەمیشەییو تەئلیفاتە، دیارە کارلێکی ئەم لایەنانە بەسەرو مڕی توخمێکی گرنگ دێننە گۆڕێ کە ئەویش نەك دەوڵەمەندیە لە زانستا بەتەنیا، بەڵکو تیژی بیرەوەریکانی ئەم زاتەیە، تیژی بیرەوەری هەر مرۆڤێك دەکاتە نەمری مانەوەی تاقیکردنەوە زۆرەکانی ژیان بەهەردوو بەشەکەیەوە تیۆریو پراکتیك.

ئەو کاتانەی کە خوێندکار بووم لە زانکۆی بەغدا ئامشۆی هەمیشەیی ئەم زاتەم دەکردو سوودی گەورەم لێ دەبینی، دیارە پەیوەندی خوێندکارێکی زانکۆ لەگەڵ کەسایەتیەکی وەهادا حاڵەتێکی خۆڕسكو کاتی نییە، بەقەد ئەوەی کە پەیوەندیەکە خێزانیو کۆمەڵێك شتی ترە، وەك ئەوەی کە مامۆستا عەبدولکەریم جگە لەوەی کە هاوڕێو خۆشەویستی باوکمو مامەکانم بوو، لە کاتی خۆیشیاو لەسەردەمی شێخ صدیقی شێخ مەعروفی نێرگسە جاردا مودەریسی مزگەوتی نێرگسە جاربوو کە مەڵبەندو زێدی بنەماڵەکەمان بوەو کۆنترین شوێنەواری زانست بوە لەو ناوچەیەداو تەنانەت شێخ عەبدوڵقادری گەیلانیش سەردانی کردوە، ئەمە جگە لە پەیوەندی ڕۆحی مامۆستا لەگەڵ بنەماڵەی مەولەویدا بەتایبەت شێخ محمد سەعیدی گوندە، کە کورەزای مەولەویە، دیارە لەم هەلو مەرجە لەبارەدا هاتو چۆو سەردانو پەیوەندی توندو تۆڵی من لەگەڵ ئەم زاتەدا ئاساییو تەنانەت پێویستو ئەرکیش بێت.

مامۆستا عەبدولکەریم ئەوکاتانە لە مزگەوتی ئەحمەدی نزیك وەزارەتی دیفاع بوو لە بەغدا، بۆیە زۆربەی کاتەکان بەتایبەتی شەوانە دەچووم بۆخزمەتیو لە نزیکەوە لە مەجلیسەکانیا دادەنیشت، زۆر جار ئەوەی کە لە زانکۆ قورس بوایە لە لام، یان بمویستایە پێش وەخت بیزانم پرسیارم لێ دەکردو ئەویش وانەکەی پی دەوتمو شتە نەزانراوەکانی بۆ ڕوون دەکردمەوە، ئەو صرفو نەحوەی کە ئەو دەیزانی مەگەر یەك کەس زانیبێتی ئەویش د. فاضل سامەرائی بوو، جارێکیان پرسیارێکی (صرف)ی لێ کردم کە ئەویش ڕەچەڵەکی وشەی (أشیاء) بوو، چونکە هێشتا نەم خوێندبوو نەمزانی، بە پێکەنینەوە فەرموی ئەم پرسیارەو گەلێکی دی لەخۆم کرا کاتێك کە هاتمە بەغداو لە مزگەوتی ئەحمەدی دامەزرام بەڵام من پیاوانەو خێرا زانیم نەك وەك تۆ! ئەوەندەی من لە مەجلیسەکانی رامابم هەمیشە ڕەفتارو وەڵامو پەیڤەکانی لە ئاست خەڵکە جیاوازەکاندا بەقەدەر خۆیان بوو، زۆر جار لە ئاست میوانێکی شارەزوری کە ڕەجافدا بەجۆرێك ئەئاخاوت وات دەزانی یەکێکی چون خۆیەتی، جاریش هەبوو لەگەڵ ڕۆشنبیرو زانا گەورەکاندا بەجۆرێك دەپەیڤا کەرێو شوێنیان پیشان بدات، یەکێك لە خەسڵەتە گرنگەکانی ئەم زاتە ئەو مەوسوعیەتەیە کە لە هەموو بوارەکاندا ئەسپی خۆی تاو داوەو لەوەدەچێت دوای ئەمو مەسعود موحەمەد ئەو جۆرە مەوسوعیانە لەنێو کوردا نەمێنن، هەزار ئەفسوس! هەندێك جار دەچووم بۆ شێخ عەبدولقادری گەیلانی بۆ سەردانیو ئامادەی مەجلیسە فرەکانی دەبوومو چێژو سوودی تایبەتم لێ وەردەگرت، ئەو هەموو ڕوناکبیرو مەلاو خوێندکاری باڵاو دکتۆری زانکۆیە بەبێ جیاوازی ڕەگەز دەهاتنە خزمەتیو لەبوارەکانی نحو، صرف، بلاغە، شرع، منطق، فرائض، کلام...پرسیاری پێچەڵ پێچو قورس قورسیان لێ دەکردو وەڵامی هەموویانی ئەدایەوە، جار هەبوو کێشەی شەرعیو قەزائی گەورەیان بۆ دەهێناو ئەویش داوای مۆڵەتی لێ دەکردن، دیارە پێویستی بە



رامانو فەتوای تایبەتی هەبوو، دەتوانم بڵێم لەسەرو بەندی خۆیدا بەیەکێك لەوانە دەژمێررێ کە هەمیشە بیری لە کردنەوەی دەقە داخراوەکان کردبێو بەدوای تەئویلی جۆر بەجۆردا گەڕابێ، بەمەبەستی ڕاپەڕاندنی کاروباری خەڵكو دوورخستنەوەیان لە کێشەو نەهامەتی، جارێکیان لە نێوان هەردو نوێژی مەغریبو عیشادا لە خزمەتیا دانیشتبووم، میلی ڕادیۆکەم دەگێڕا، بەڕێکەوت چوە سەر گۆرانیەکی هەورامی خۆش کە هۆنراوەی مەولەوی بوو، مامۆستا فەرموی بیوەستێنەو دەنگی بدەرێ، مەگەر ئەم گۆرانیە ئاو بکات بە دڵدا، وانیە شێتە؟! منیش وتم چۆن وانیە؟! مامۆستا لەبەر خۆیەوە گۆرانیەکەی دەوتەوە، کە ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم گۆرانی (هەی یاران یاران) بوو، ئیتر مامۆستا لەبەر خۆیەوە گۆرانیەکەی دەوتەوە خەریك بوو شاگەشکە بێت لە خۆشیدا.

ئەو کاتانەی کە هەندێك خاوەن پرسیار سەر سوڕهاتنیان پیشان ئەدا لەوزەو توانا باڵاکانی، مامۆستاش زۆر بەتەوازوعەوە دەیفەرموو ئەمە ئیرادەی خوایەو چی بیەوێت دەیکات، جارێکیان داوای لێکردم کە پەرەگرافێکی لە تەفسیری (کشاف) بۆ بخوێنمەوە، دوای گوێ گرتنو تیاڕامان فەرمووی ئەگەر ڕای تایبەتی خۆت نەبێت لە نێوان ئەم موفەسیرانەدا ون دەبیت، خوێنەری ئازیز بالێرەدا هێندە بەس بێت،

هەزار درود بۆ گیانی پاکی ئەم زانا گەورەیەی کوردی سەدەی بیستەم.

# دیمانەیێکی کورت لەگەڵ

# عەتیەخانی کچی مامۆستا (مدرس)دا

ئەڵبەت قسە کردن یا نووسین لەسەر کەسێتییەکی وەکو مامۆستا (مەلا عبدالکریمی مدرس) چەند مێژگردوو دانیشتن‌و کتێبی دەوێ، ئەگەرچی تا ئێستا بەداخەوە ئەوی پێویست بێ دەربارەی ئەو زاتە نەنوسراوە، لەسەرو بەندی خۆ ئامادە کردندا بوین، بەنامە پەیوەندیمان کرد بە کاك (محمد)ی کوڕیەوە، بەو پێیەی کەسێکی نزیك‌و بە ئەزمون‌و لە هەمان کاتدا هاوکاری زۆرینەی کارەکانی بووە. وەڵێ بەداخەوە هیچمان بەدەست نەگەیشت، ئیدی لەم دواییەدا زانیمان بەهۆی نەخۆشیەوە نەپرژاوەتە سەر ئەوەی هاوکاریمان بکات لە ئامادەکردنی ئەم ژمارەدا.

ئێمە لە ڕۆڤار– مەبەستمان بوو جگە لە گوڵەوە چنی کارەکانی ئەو مامۆستا دەست ڕەنگینە لەو چەند لاپەڕەیەی خۆماندا مەیدانی تربین. ئیدی وا کەوتەوە تا ڕۆژی 22ی/7 بۆمان ڕەخساو سەردانێکی ساتەوەختی (عەتێ خانی کچیمان کرد تا هیچ نەبێ ئەوی لەیادەوەری ئەودایەو ئێمەو مانان ئاگامان لێی نیە قسەمان بۆ بکا..

میوانداریەکی شیرین بوو بە تایبەتی کە مەجلیسەکە هەر بۆ قسەکردن بوو لەسەر ئەو زاتە ووتمان:

***حەزمان دەکرد بچینە کن مامۆستا خۆی بەڵام دیارە ئەوە نارەخسێ، عەتێ خان وەڵامی داینەوە.**

–(باوکم/ جگە لەوەی ڕقی زۆری لە سەفەرە ئێستاش هەیکەلێکەو وەکو جەستە کەڵکی هیچی پێوە نەماوە.. کوڕێك لە حوجرەکەیدا خزمەتی دەکا، بەتایبەتی بۆ کاری دەستنوێژ.

***باشە ئێوە نازانن بۆ رقی لە سەفەرە؟**

–هەر وا بووە تەنانەت کاتێ لەگەڵ (شێخ تاهیری سۆڵە)دا هاتنە سلێمانی بۆ بەشداری لە پرسەکەی خوالێخۆش بوو مامۆستا –شێخ محمدی خاڵ–دا هەر ئەوەندە مایەوە لەناو مەراسیمەکەدا بێ دوایی گەڕایەوە.

***دەڵێن‌و ڕەنگە هەرواشبێ، کە مامۆستا بەهۆی خوا پەرستی‌و نووسینەوە، زۆر تەریك بووە؟**

–هەر زۆر، ئێمە لەساڵی 1972وە پاش نوێژی جومعەو بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ نەبێ نەمان بینیوە، باوکم ژیان‌و هەڵس‌و کەوتی ناو فەقێیان زیاتر بە ژیان دەزانی.

***ئەی ئێوە وەك خێزان؟**

–هەمیشە تەئسیری مەعنەوی لەسەرمان هەبووەو گەشەی پێ کردووین، ئێمەش هەمیشە لە حوجرەکەیدا بەسەرمان کردۆتەوە، چونکە بەڕاستی پیاوێکی زۆر عاتفی‌یە.

***وەك زانیاریت هەبێ بەتایبەتی ئێوە کەماوەیەك پێش ئێستا لە بەغدا بوون دەبێ دوا کاری مامۆستا چی بێت؟**

–ئێستا دیوانی سالم ئامادەیە بۆ چاپ، هەروەها تەفسیری نامی–بەکورتکراوەیی تەواو کردووە بەرگی یەکەمی لێ چاپکراوە.

***ئەوی ئێمە لە کتێبی ( علماؤنا فی خدمە العلم‌و الدین ) بەرچاومان کەوتبێ بەشێکی زۆر کەمە لەسەر بوردەی ژیانی مامۆستا مودەریس دەبێ لەو بارەیەوە شتی تر هەبێ؟**

–(ژیان نامەی خۆمم نووسیوەتەوە بەڵام بادوای ئەوەی لە ژیاندا نەمام ئەوسا بڵاوبکرێتەوە) ئەمە قسەی باوکمە، ڕاستە ئەوی لەو کتێبەدا ئاماژەتان پێدا هەموو ژیاننامەکەی نیە.

***بیرەوەرییەك؟**

–باوکم زۆرشتی خۆی بەنهێنی ئەهێشتەوە، بۆ نمونە لە شەستەکاندا–کاکە حەمە–ی برام گیرابوو، لە سلێمانیەوە– مامۆستا شێخ محمدی خاڵ–ی ڕەحمەتی نامەی بۆ دەنێرێ‌و تیایدا هەواڵپرسی کاکم دەکا، ئەویش لە وەڵامدا بۆی دەنوسێتەوە (باشە) لەسەر ئەمە دایکم کە (گەنجینەی پێشینان) بوو لێی دەپرسێ بۆ ئاوا؟

باوکم پێی ووت: ئەگەر بۆی بنوسمەوە لە حەپسخانەیە تووشی خەفەت دەبێ جا بۆ من ببمە مایەی دڵتەنگ کردنی دۆستێك، خەمی خۆمان هەر بۆخۆمان.

***هەرگیز مەجالی ڕەسم گرتنی نەداوە، مەگەر دەرفەتی لێ هێنرابێ،** تەنانەت ڕێکەوتێك وا بوو کە خێزانی هەموو پێکەوە بین بۆیە بە چاکمان زانی بەکامێرای ڤیدیۆ ئەو دانیشتنە بکەینە یادگارێکی زیندوتر، پاشان باوکم پێی زانی تورە بوو لەبەر ئەوە وازمان هێنا.